# نازی ماچ

بەلێوی...
عەیارت بلێ،
مەکرو نازم پێ نەفرۆشێ
لەدوای...
هەموو ماچێکەوە،
مەیکەدەم وەکو سەرخۆشێ
ئەو لێوانەت...
هێندە سیحرین، کاتێ بەر لێوم
دەکەون
لێوەکانم...
هەرئەوەندەیان لەدەست دێ
لەبەر لێوتدا بکەون.





# ماچو پیری

ئاخ گوڵەکەم...
خەم بۆ ئەو رۆژانە دەخۆم،
کەتۆم تیا ماچ نەکردووە
وا هەستەکەم...
ئەو رۆژانەم بێ مانا بوون،
هەر خۆمم تیا پیر کردووە
بڕوا بکە...
هەموو جارێ ماچێکی تۆ..
ئازارەکانی دڵیشم لەبن دێنێ
کەدڵنیام...
هەر لێوێکم لەنەخشەی هەست یاخی دەبێ
گەر واز لەو ماچانە بێنێ.

# قەرزی ماچ

ماوەیەکە...
بێ ویستی خۆم، لەتۆ دوورم
کەنەت دیوم
نازانم...
چەند قەرزی ماچت لەدەفتەرا
بۆ نووسیوم؟
ئەگەر بێتو...
قەرزەکانی جارانیشم..
لێ بستێنی
ئەبێت...
نۆ بەرەی ئەوینت..،
لەسەر لێوی من بنوێنی
کچێ بەخوا...
من نازانم چەند رۆژە
ماچم نەکردووی؟
ئەوەندەم...
هەواڵ زانیوە، حەزی لێوم
شێتی کردووی.





# ئاخ ماچ

ئاخ...
چەند بیری جێگە ژوانی
نیوە ئاشتی و نیوە شەڕەکانت
دەکەم
چەندە بیری...
نەرمە پیاسەی ئێواران و
تەزوی گەرمی ماچە
تەڕەکانت دەکەم
باوەڕت بێ...
لەوەتای ماچەکانی تۆم لێ بڕاوە،
وا هەستەکەم، شیعرەکانم کاڵ
بوونەوە
بێ ماچی تۆ...
لێوەکانم دەڵێی درەختی شەق بردوون
لەچیاوە بەر بوونەوە.

# بەرواری ماچ

لەوەتای ماچم نەکردوی...

نە سەیری رۆژمێر دەکەم

نە کاتژمێر لەدەست دەکەم

نە دەپرسم چەند شەممەیەو...

نەچەکمەجەی دۆلابەکەم دەکەمەوە

نە سەیری ئاوێنە دەکەم

کەس نازانێ...

نهێنی هەموو ئەمانە،

لەچی دایە

کەس نازانێ...

لەئاوێنەو، لەبەر وارو، لێوی مندا

تامی ماچی تۆی تێدایە.





# بێشکەی ماچ

ماچەکانت...

وەکو بێشکە رام دەژێنن،

وەکو نۆبەی زەمین لەرزە

دەم هەژێنن

وەکو...

شەختەو زریانو.. با

دەم تەزێنن

ماچەکانت...

ئاخ گوڵەکەم...ماچەکانت،

دەمکوژنو.. رۆح لەجەستەم

دەر ناهێنن.

## خولیای ماچ

چەند خولیای...
نیگای چاوەکانت بووم
چەند تینوی...
ماچی لێوەکانت بووم
دە ترسام بمرم...
دوا ماچت نەکەم
ئێستا...
دڵشادم ئاوێزانت بووم
چون تاسەی...
دووری‌وماچت شکاندم
وەك ...
منالی ناو دەستەکانت بووم.





## سوراوی ماچ

تەنانەت...
ئاوێنە کەشمان،
نهێنی ماچەکانمانی
پێ زانیوە
چونکە...
هەزار جار سوراوی
لێوەکانتی بەسەر لێومەوە
بینیوە
خۆشی...
لەخۆمان گوڵەکەم،
ئاوێنە زمانی نەبوو
ئەگەر...
زمانی هەبوایە،
کێ دەڵێ لەوماچانەمان
بێ دەنگ دەبوو؟

# دەرگای ماچ

کەلێو...
دەنێیتە سەر لێوم،
خۆشم لەبیر دەچێتەوە
بەچرکەیەك...
دەرگای هەزار ماچی داخراو
دەکرێتەوە
هەنگی لێوم...
تێر لەشیلەی لێوت ..
دەمژێو
بەهەنگوینی...
ئەو ماچانە، تەمەنم..
نوێ دەبێتەوە.





# نەزیفی ماچ

هەرچی جاری...
کەدێی بۆلام، نەزیفی ماچمان
بەر دەبێ
لێوت...
دەبێت بەئاگرو، لەخەرمانی لێوەکانی
من بەر دەبێ
وەلێ چی بکەین..
کات لەوێدا باڵ دەگرێتو
حەزی ماچ کۆتایی نایە
دوای هەزار جار...
ئاوێزان و لێو کرۆشتن، هێشتا دەڵێی
یەکەم ماچەو سەرەتایە.

# مەملەکەتی ماچ

وەکو تلیاك...

مودمینی ماچەکانت بووم،

بۆیە ناتوانم ولآتی لێوەکانت

بەجێ بێلێم

کاتێ دەڕۆی...

لێوی تەنیایم دەگەزم،

هەتاکو دەگەڕێیتەوە

ساتەکانت بۆ دەژمێرم

لەنهێنی...

ئەو دوو لێوانەت تێناگەم،

نازانم چ ئەفسانەیەك لەناو

ماچەکانتدایە؟!

ئەو رۆژانەی...

کەتیایدا ماچم نەکردویت،

واهەستە کەم گۆڕستانی مێژۆوی

تەمەنمی تێدایە.





# کلّپەی ماچ

کەدەتبینم...

گڕو کلّپەم بەماچ نەبێ،

بەتەوقەیەك دانامرکێ

دەزانێ.. تفەنگی لێوم لەسەر پێ یە

بەلآم لەناو ئەو خەلّکەدا..

بۆم ناچر کێی

هێندە...

حەزی ماچێکی تەڕ...،

لەسەر لێوم کۆ بۆتەوە

ناوی...

شیعرەکانی خۆمو..

وەرزەکانم بیرچۆتەوە.

# ژیانو ماچ

گەر...
سامانی دنیات هەبێ،
حەزی من هەر لەماچێکی
لێوتدایە
گیانە...
من پارەم بۆ چیە..؟
کەژیان خۆی لە ئارەزووی
ماچێکدایە
هەتا...
ماچی لێو وەستابێ،
پاکژ لەسامان چی یەتی؟
هەر کەس...
بۆ ئەوە دەگەڕێ،
هەیە، بەڵام ئەو نیەتی.





# شەرمو ماچ

با...
ماچێکت بکەم گیانە،
لەو دوو لێوە پڕشەرمانەت
بەڵکو...
خامۆش بێ ئاگری..
ئەو دوو چاوە پڕ گومانەت
ماچێك گیانە...
کۆتایی بەجەنگی ساردی
نیگاو شەرمو تر س دێنێ
ماچێك گیانە...
دیواری بەرلینی گومان،
لەبەردەمیا هەرەس دێنێ.

# کەوسەری ماچ

وا هەستەکەم...
ئەگەر رۆژێ تێپەڕێت و
نەتبینم و ماچت نەکەم،
کەئێواران دەرۆمەوە...
لەناسینەوەی ژمارەی
دەرگاکەشمان هەڵە دەکەم
بۆیە ئەگەر...
دەتەوێ وەکو ئێواران
دوای راموسان، بەوشیاری
بڕۆمەوە
رێگەم بدە...
هەموو رۆژێ لەحەوزی
کەوسەری لێوت پیاڵەیەك
ماچ بخۆمەوە.





# سواڵی ماچ

ئەگەر...
سواڵم بکردایە،
پارەم لەدەستەکانی تۆ
وەرنەدەگرت
هەزار کەڕەت...
لەچاوت دەپاڕامەوە،
تاماچێکی لێوم دەکرد
ئیتر...
هەتا دەهاتیەوە،
هەر ئەو ماچە دەیژیاندم
ئەگەر رۆژێ...
خێری لێوت نەکردایە،
برسێتی ماچ دەی گریاندم.

# تویّی ماچ

هەر...
رۆژیّ کەتۆ ماچ دەکەم،
لەنووسینو گفتو گۆدا
زمانم دەلّیی تویّی ئاوە
لەفەلسەفەی
ماچ نوسیندا.. فەیلەسوفم
چونکە تلیاکی لیّوی تۆم
لەدەم ناوە
هەر رۆژیّ...
لەماچەکانت بیّ بەشم کەیت،
بەناچاری تالّی دەکەم
بەهۆنراوە
چونکە...
دەزانم هەرچیّکی کەدەی نووسم
لەبەر دەمی ماچیّکتدا رستەیەکی
ناتەواوە.





# سیّوی ماچ

ئەم ماچەیان...
لەهیچ ماچیّکی تر ناچیّ
باوەڕناکەم...
هەتا مردن، لەسیّوی دلّم
دەرناچیّ
ئاخر چی بکەم...؟
بیّ ماچی تۆ شیعرەکانم
بیّ هەویّنن
ئەلّیی...
دیلی ناو زیندانم، لیّوەکانت
کەدیّنن ئازادیم بۆ دیّنن.

## ڕقی ماچ

هەرچی دەکەی...
هەرچەند خۆتم لێ توڕەکەی
ئەگەر ڕۆژێك تا ئێوارە..
بێیت و بچیت،
سڵاوێکیشم لێ نەکەی
بەرلەوەی...
لێك جیابینەوە،
هەرکە دەرفەتێك هەڵکەوت
دێیت و خێرا ماچێکی ناو..
دەمم دەکەی.





## خەونە ماچ

شەوێك نیە...
نەیەیتە ناو دواساتی
خەونەکانمەوە
ڕۆژێك نیە...
لێوەکانت نەکەونە ناو
تەڵەی دوو لێوەکانمەوە
هەموو ڕۆژێ..
هەموو شەوێ..
تۆ هەر جوان و منیش لەڕێی
مانگ و خۆرا
هێندە...
لێوەکانمان بەسەر..
لێوی یەکدا دەتوێنەوە،
هاکا ڕۆژێ لێوەکانیشمان لێگۆڕا.

# شەختەی ماچ

**لەماچێکدا...**
**شەختەی لێوم..**
**کەبەلێوی نەرمت دەگات**
**وا دەزانم...**
**ژیان لەگەڵ ئەو ماچەدا**
**دەست پێ دەکات**
**وەرە گوڵم، بۆ یادگاری**
**با دنیایەك ماچ تۆمارکەین**
**مەرگ...**
**میوانی ناوەختە،**
**بۆ چاوەڕوانی ڕۆژگارکەین؟**





# دەڵێم ماچ

**من...**
**داوای ماچت لێدەکەم،**
**تۆ پێم دەڵێی..**
**- باسوراوەکەم تێك نەچێ**
**ئەگەر...**
**بێ ماچ بڕۆمەوە،**
**هەتا مردن، ڕەنگە**
**لەدڵم دەرنەچێ**
**من پێت دەڵێم...**
**- با ماچێکی گەردنت کەم،**
**نەبا بڕۆم بەم زوانە..**
**نەت بینمەوە**
**نەبا دووریی‌و...**
**حەزی ماچێك..،**
**مەرگ بنێن بەژینمەوە.**

# ماچو پێکەنین

هەر کەدێی...

بێ ئەوەی هیچ بلێی،

دەزانم بەبێ دەنگ

چیت دەوێ

دەچیتە...

ئەو دیوی دەرگاکەو..

پێم دەڵێی.. دەی ماچی

کوێت دەوێ؟

منیش هەر...

ماچێکی لێوتم مەبەستەو..

دەستێکیش بگێڕم بەباخی سینەداو

دوو وتەو یەك قاقای پێکەنین

ئەی...

بۆ خۆت پێم ناڵێی..

- درەنگە ماچمکە..؟

نەبادا کەسێ بێ لەماچو

دەست بازی تێر نەبین؟





# لیمۆکانی ماچ

وەکو منداڵی شێتۆکە...

بەدیواری لێوەکانتا..

هەڵدەزنێم

لیمۆکانت...

هێشتا کاڵن نایانڕنم،

بۆخۆت دەزانی

بۆچی دێم

ئاشق نەبێ...

کێ دەتوانێ شەڕ

لەمەرگ بباتەوە؟

پەلی سەرت دانەوێنە...

بەرسیلەی ترشی ماچێکت

مردنم بیر دەباتەوە.

# زمانی ماچ

بۆ گوڵەکەم...
لەهەنگوینی لێوەکانت
بێ بەشبم من..؟
کەماچێکت ژیان و
مردنیش دێنێ
وا هەستەکەم...
زمانی من کۆرپەیەکەو..
دوو لێوی تۆش وەکو بێشکە،
منداڵی گریاوی ماچم رادەژێنێ
دە وەرە...
ماچێکم بەرێ..،
با هەڵقرچان بەری درەختی
ماچ کردن نەوەرێنێ
دەرگا لەرووی...
لێوەکانم کلیل مەدە،
نەبا خودا لەسزای ئەو دڵە رەقەت
لە دۆزەخدا بت سوتێنێ.





# ڕووباری ماچ

من...
لەم بەری روو بارەکەم،
تۆش لەو بەری..
ئاخ نامگەیتێ
من...
بەئاوی ئەم روو بارە..،
ئەفسانەی تینوێتیم ناشکێ
ئەگەر تۆ ماچێکم بەیتێ؟
سا تۆ بیتو...
پاڕانەوەی ئەم نەوڕەسە
چاوەڕوانە؟
با ماچێکی لێوت بکەم...
خۆ لافاوی نوح هەڵناستێ
لەم شاعیرە سەرگەردانە.

# باجی ماچ

من حەز دەکەم...
ئەم شەو هەزار جار
ماچت کەم
وەکو...
قاچاخێکی گیراو
سەد جار، بەجارێ
باجت کەم
تا بەیانی...
بەدیارتەوە دابنیشم،
ماچت بکەم و نەخەوم
چونکە...
دەزانم رۆژێ دێ
پیر دەبم و لەماچ کردنیش
دەکەوم.





# ئامێزی ماچ

وا...
هەفتەیەکە تەنیام و
لەماچەکانیش بێ بەشم
چەند غەرییم...؟
من نازانم وێلی کام..
رۆژگاری رەشم ؟
وەرە...
با تاسەم لەماچت بشکێنم و
تێر تێر بتگرمە..
باوەشم.

## ڕێگەی ماچ

كەمن موحتاجی ماچێكم
لە بەرچی ڕێ بەلێو
نادەی؟
كەتۆ مندالًی سەر شێتی
عەجەب ئەمرۆ جنێو
نادەی؟
نەهێڵی لێوم بەر لێوت
كەوێ، چۆن شیرین بێ
لێوم؟
نەهێڵی دەستم بەر سینەت
كەوێ، چۆن شێتو..
بزێوم؟





## گرەوی ماچ

من...
كەلەخۆشم تۆراوم
تۆ چۆن ئاشتم دەكەیتەوە؟
من...
كەهەمیشە گریاوم
تۆ چۆن ژیرم دەكەیتەوە؟
تۆ...
لەو پەڕی وشیاریدا
گرەوم لێدەبەیتەوە !
كەدێی...
ماچێكم دەكەیتو..
بۆ ژیانم.. دەبەیتەوە.

## سەختی ماچ

چەند سەختە...
ڕۆیشتیتو ماچێکم نەکردی؟
یادگارە جوانەکان...
زریانی کۆچ بردی
چەند جوان بووی...
لەکۆشکی ئەوینی خەیاڵا؟
چەند دوور بووی...
لە پێکی مەستانەی خەیاڵا؟
ڕۆشتیتو...
لەدوای تۆ، کێ دڵی تەنیایم
باتەوە
من لەکێ زویربم...؟
ئەو بەماچ بێ..
ئاشتم کاتەوە.





## ماچێکی تاڵ

ماچێکی تاڵم کرد...!
ماچێکی ساردم کرد لەلێوی
ئەو لێوی نەکردم...
بەتامی شەکەری سەر لێوی
هەستمکرد...
ماچ نیە، تاوانم کردووە
هەستمکرد...
من دەمم بۆ زستان بردوە
چەند تاڵ بوو...
وەکو لێو گەزینی دوای تاوان؟
چەند سارد بوو...
وەك لێوی تەزیوی ناو زریان؟
ماچ نەبوو.. تاوان بوو
ماچ نەبوو.. زریان بوو.

# فیردەوسی ماچ

با بچین بۆ ئەشق...
با بچین بۆیاری
بابچین...
بۆ کەنار رووبارێك، ئەوین و
جیٚ ژوانی دڵداری
با بچین بۆ فیردەوس...
بەهەشتی پیٚکەنین
با بچین دەست بکەین...
بەسیٚوی ماچ ڕنین
دەزانم.. هەردووکمان
لەبەهەشت دەردەکەن
نازانن ماچەکان...
بەدنیا وەردەکەن.





# گێڕانەوەی ماچ

*بڕیارمدا...*
ئەمشەو هەموو ماچەکانت
کۆکەمەوە
بۆ ئەوەی...
گەر بەجیٚت هیٚشتم،
هەموویانت بدەمەوە
چونکە...
دەزانم لەمەو دوا..،
ئیتر ماچت ناکەمەوە
بۆ ئەوەی...
ماچت لام نەبیٚت
کەبیری لیٚ بکەمەوە.

## بەیاری ماچ

هەر کەسێ ماچت کات
پێویستە بزانێ..،
لێوی تۆ بەیار بوو، من کردم
بەباخی شەکرە سێو
هەر کەسێ...
لێو بنێ بەجامی کەوسەری
لێوتەوە
پێویستە بزانێ...
جێ ماچی ڕابردووی
من دەکێڵێ بەلێو.





## دەفتەری ماچ

هەموو شەوێ...
بەر لەخەوتن، بێ ئاگای خۆم،
دەبینم پێنوسەکەم و دەفتەرێکم
لەدەستدایە
هەر کەشیعر...
دەیەوێت داگیرم بکات،
ماچەکانت لەسەر لێوی
یەکەم فیشەکی جەنگدایە.

# هەناسەی ماچ

لێت تورە بووم...
ئیتر نایەم، ماچت ناکەم
ئیتر نایەم...
دەم بۆ سێوەکانت نابەم
نەبا هەناسەم بۆن بگرێ
ئیتر...
تەوقەت لەگەڵ ناکەم
نەبا دەستم هۆگرت بێ
نایەم...
تەماشای تۆ ناکەم،
نەبا چاوم رەنگت بگرێ
ئیتر نایەم...
بەیەکجاری لەبیر خۆمت
دەبەمەوە
ئەگەر وەرزێك...
لەبەر ماڵەکەم راوەستی
دەرگات لە روو ناکەمەوە.





# لێوەکانی ماچ

لێوەکانت...
تەڕو بڕن وەکو باران
لێوەکانم...
خاکی دێمن وەکو جاران
ماچەکانت...
ئارامی دەدەن بەلێوی
پڕ لەتاسەم
ماچەکانم...
پێشکەشت بێت هەتاکو..
دواین هەناسەم.

# نامۆیی ماچ

بۆ کوێ بچم...

هێندەی غەریبی

خۆم نامۆم

لەناو لێوی...

کچانی زەوی و ئاسماندا

ئۆگری ماچەکانی تۆم

نازانم تۆش...

هەروا تامت لەماچەکانی

من دیوە؟

یان ئێستاکە...

حەزی ماچت بۆ لێوێکی

تر گۆڕیوە؟!





# پەپوولەی ماچ

وەك پە پوولە...

ئەگەر تەنها رۆژێك بژیم،

هێندەم بەسە دەم دەنێمە

ناو گوڵی لێوەکانتەوە

کەدڵشادم...

مردنم بێ مانا نابێت..،

چونکە ناوم دەچێتەناو

دەفتەری ماچەکانتەوە.

# نۆ بەرەی ماچ

من ئێستا...
لەبەردەم ئاوێنەی پیریدا،
تەماشای یادگاری سالآنی
زوو دەکەم
تۆ هێشتا...
نۆ بەرەی سێوێکی بەهەشتی..
بۆ لێوت دەبەخشی بەلێوی کەنەفتم
دیدەکەم؟
دەزانم...
تۆ سەرت هیلاکی ئامێزو
خەوتنی سەر سنگی
پیریمە
بەلآم من...
کەلێوم ناچێتە ماچێکت
بزانە حیکمەتی ویژدان و
ژیریمە.





# هەشت ماچ

ئەمڕۆ...
هەشت ماچم لێت دەوێ
ئەمڕۆ دەبێت...
هەشت جار لێوم..،
بەر هەنگوینی ماچت کەوێ
ئەمڕۆدە بێت...
لێوە کانت هەشت جار بمژم
وەك مەساسە
گیانە...
دەڵێی نەتزانیوە..،
ئەمڕۆ یادی ( ٨ )ی مارسە؟!

# جەنگی ماچ

نەجەردەمو نەریگرم،

نەسەر بازێکی شەڕانی

پێش بەرەی جەنگ

نە خە نجەری...

دەم ژەهراویم..،

نەلولەی پڕ مەرگی تفەنگ

نەچاوم...

خوێنی تێزاوە..،

نەژیانیش تیرۆر دەکەم

هاتووم...

ئەگەر نەگۆڕابیت..،

ماچێکی ناو دەمت دەکەم.





# لاپەڕەکانی ماچ

ئەگەر رۆژێ...

لێوم هەڵچەقێ لە پەڕەی

گوڵی لێوت وەك دڕکەزی

ئەگەر شەوێ...

لەناو دەمی ئاسمانەوە..،

گەزۆی ماچێ بۆ لێوەکانم دابەزی

تاوانبارم نەکەی بێژی

- ئەم شاعیرە چەند شێتێکی

ناتەواوە؟! ئەو...

شێتانە گەلێ جوانن

کەماچێکی شیرین دەکەن

بەهۆنراوە.

# شیلەی ماچ

حەیفە گەر چاوم بەچیمەن
بۆ لەژێر پێت رانەخەم؟
تۆ دەمت شیلەی گوڵان و..
منیش تینوی ماچی دەم
هەر کە شوشەی لێوی تینوی
من شکا بەو ماچەوە
با مەسیح ئاسا مەلی رۆح،
دەر بچێ بەو خاچەوە.





# تروسکایی ماچ

تۆ نازانی لەکەیەوە...
لێوی من رەق هەڵاتووە؟
لەو رۆژەوەی کەماچی...
تەڕی لێوی تۆی نەکردووە
گیانە لەکوێی...
گوڵم لەکوێی بۆ نامگەیتێ ؟
بەڵێن نەبوو...
کەئێوارە هاتم بۆلات ماچم بەیتێ؟
من هاتم و هەرچی...
تروسکەی هیوایە لەچاوەکانتدا نەبوو
من هاتم و ماچەکانم...
لەتاریکیدا لێ ون بوو
ماچی لێوەکانت نەبێ ...
ئەم زستانە رەق دەبمەوە
وەرەو دواین ماچم بەرێ
نەبا ئیتر نەتبینمەوە.

# گیانی ماچ

لەگەڵ...
وەرینی هەر گەڵایەکدا،
گیانی ماچێکمان خەزان
دەیکێشێ
خەم...
دەڵێی لێوی حەمە عومەرە
تەمی پایزو خەزان..
دەکێشێ
لەنێوان...
ماچو.. لێوی منو تۆ..،
ئافاتێك هەیە پێی دەڵێن
خەزان
خۆزگە...
لەگەڵای لێوی هەڵوەریو..،
پاڵتۆی ماچێکمان دەکرد
بۆ زستان.





# ماچی سەبا

بەدەم...
پیر بوونو هەڵوەرینەوە،
پۆل پۆل گەڵای ماچ..
ڕەشەبا دەیبیا
گەڵاش...
وەك لێوی منو تۆ ڕۆژێ،
لێوی دەبەخشی بەماچی
سەبا
ئێستاش...
ئەو هەموو ماچوگەڵایە،
لەناو پێدەشتو ئەشکەوتی
شاخا
کەس نیە...
دەمێ.. لەدەمیان باوێ،
قۆڵێ بۆ سەری هیلاکیان
ڕاخا.

# کۆتەڵی ماچ

سەر...
لەئامێزی گەلاَی وەریودا،
لێو لەسەر لێوی جگەرەو..
دوو کەڵ
بەفر...
لەتاڵی قژی دەبارێ‌و..
ژیانی بۆتە ئەفسانەی
کۆتەڵ
ئاخۆ...
چۆن ماچی ئەو گەلاَیانە،
لێوی دەباتە سەر مەرگی
پایز!؟
ئاخۆ...
چۆن وەکو لێوی ماچ کوژراو
دانیشێ لەسەر تەرمەکەی
ئازیز؟!





# سەوزایی ماچ

لەدوو توێی...
لێوی هەر دێراوێکدا،
هەمیشە ماچی گەلاَی وەریوە
ئەو دێراوانەی...
جارێك پێش مەرگ،
ماچێکی گەلاَی سەوزیان نەدیوە
هەر بۆیە دەڵێم
– ژەنراڵ پایز..،
لێوی ئامێزی ماچی خەزانە
چونکە...
لە پرسەی هەر گەلاَیەکدا،
رۆحی دووکەڵی دەمی بورکانە.

# تەرمی ماچ

لەگەڵ...

کسپەی وەرینی هەر گەڵایەکدا

منیش گەڵای تەرمی ماچێکم

دەوەرێ

رۆحی...

تەڵایی ئەو ماچە کوژراوانە

شەهید ئاسا بەرەو لوتکەی لێوەکانم

دێنە سەرێ

هەر گەڵایەك...

پڕ لەحەزی جوانە مەرگ و

پڕلەماچی رەنگ پەمەیی

هەڵوەریوە

کێ...

هێندەی ئەم دوو لێوانە...،

مەرگی ماچ و گەڵای جوانەمەرگی

دیوە؟





# گریانی ماچ

گەڵا ڕێزانیش...

تێکەڵاو بوونی لێوی حەسرەتی

خاك و گەڵایە

ئەو ڕێژنە ماچەی...

لەئامێزیدا.. مەرگی سەوزایی و

جوانێتی تیایە

بۆ هەر گەڵایەك...

کە هەڵدەوەرێ.. سروشت

گریانی پارشیوانێکە

ماچێك لەنێوان...

خاك و گەڵادا.. هەڵچونی دەریاو

بای زریانێکە.

# وەرزی ماچ

ئەم شەو...
لەوەرزی گەلاڕێزاندا،
دەمی ماچ دەنێم بەلێوی
باوە
بۆ ئەوی...
هەر چی گەلایەك وەری
بێتە سەر لێوم هەر
لەحەواوە
نەبادا...
خاکی هیلاکی بەر پێ،
نە پەرژێ ماچی گەلای
وەریوو کات
گەلاش...
لەدەمی جوانە مەرگیدا،
شینی درەختی رووتو..
تەزیووکات.





# پایزە ماچ

با...
ماچی گەلا دەکات بۆ مەرگ ،
پایزیش لێوی نایە..
دەم خەزان
هێند...
تەرمی گەلا کەوتە سەر زەوی
لێوان لێوی خاك بۆتە..
گۆڕستان
منیش...
هەر بۆیە زۆرت ماچ دەکەم،
دەزانم رۆژێ وەك گەلای
بێ ناز
جەستەم...
لەنیوان لێوی زەویدا..،
گۆڕهەلکەن دەیکات
بەرێو بەدەرباز.

# ماچ پیر نابێ

تەمەن دەڕواو...
لێدانی دڵ لاواز دەبێ و
ئەقڵم مناڵ دەبێتەوە
بەڵام چی بکەم..؟
ماچ پیرنابێ
جەستە خۆی...
جوڵەی لێ دەبڕێ و
ڕۆح ئارامی تیانامێنێ
بەڵام چی بکەم...
لێوم دەگریا و ژیرنابێ
دەزانم...
بەر لەوەی بمرم..،
دەبم بەشەهیدی لێوت
ئەگەر...
واش بوو، بەخوێنی من
دیسانەوە سورکە لێوت.





# پێشبینی ماچ

هەتا...
زیاتر ماچت دەکەم،
زیاتر لەلام شیرین تری
لەکاتی...
هەر ماچێکتدا ..،
زەمەن لەجێی خۆی ڕادەگری
بەوەش هێندە...
ئاگر لەناخی دەروونما دەکەیتەوە
دەڵێی- ڕەنگە ڕۆژێ بمری
من...
لەسەر چرپای لێوتبم
یان تۆ لێوم لە باوەشی ماچت
بگری.

# ئیلهامی ماچ

تۆ...
ئەو ماچانەم لێ مەبڕە،
نەبا سەر چاوەی ئیلهامم
كوێر بێتەوە
خۆ من...
لەگەڵ یەكەم توركە وەنەوزیشدا،
خەونە بینم بە لێوتەوە
توو...
ئەو لێوە شەرابیانەت..،
با سروشت پڕكەین لەماچی
ئاشقانە
ئێمە دەمرین...
تەنها یادگارێك بۆ مێژوو
دیوانێك و چاپی كاڵی
ماچەكانە.





# مەستیو ماچ

بەر لەوی...
مەست بم و خۆم لەبیر چێتەوە،
دەمەوێت شەرابی ماچێكت
مەستم كات
نەبادا ...
بەمەستی بمرم و لەكاتی تەڵقیندا
خەیاڵی ئەو دەم و لێوانەت
پەستم كات
دەوەرە...
با لێوم بنێمە سەر لێوت،
نەبادا بمرین و بەماچێك
رانەگەین
كێ دەڵێ...
لەو دنیا وەك ئێرە..،
جارێكیش رێكەوتی
یەك دەكەین؟!

# بێستونی ماچ

**هاتم...**
**وە فەرهاد بێسونی سەختی**
**نەباتی لێوت بەماچ هەڵکۆڵم**
**هەر...**
**قوڵینگێکم دەوەشاند زیاتر..**
**دڵنیا دەبووم من چەند کلۆڵم!**
**دەمەوێ...**
**لوتکەی کێوێ بنکۆڵ کەم،**
**هاکا بەسەرما هەرەسی هێنا**
**ئەوسا...**
**نەک لێوم سەرا پا گیانم..،**
**قوربانی ماچەو سوورە لە خوێنا.**





# بەرگی ماچ

**رۆژێك نییە...**
**هەزار ئاشق دەم و لێوی**
**مەعشوقەکەی خۆی ماچ نەکات**
**شەوێك نییە...**
**لێوی هەزار بووكو زاوا**
**لە ماچی کەژاوەی زێڕا بەیەك نەگات**
**بەلآم کامیان...**
**ماچەکانیان لا پەڕەی مێژوو**
**ماچ دەکات؟**
**کامیان وەك ئەم شیعرە ماچە**
**ئاشقێك لەبەری دەکات؟**

# سەرابی ماچ

خۆدەزانم...
سبەینیَ ئیَمەش پیر دەبین،
ماچەکا نمان دەبن بەسەراب و
خەیالّ،
دەزانم...
مەیگیَرەکانیش..،
فریَم دەدەن وەك بادیَکی بەتالّ
بەتالّ
وەرە...
با هەتا پیر دەبین..،
دنیا پرکەین، لەماچ و ماچ و
ماچ کردن
ئیتر بەماچ...
پیَشوازی لە پیری دەکەین،
بەماچیَکیش هەنگاو دەنیَین
بەرەو مردن.





# خۆری ماچ

ئەی...
خۆت نالّیی:
- ئەگەر رۆژیَ ماچم نەکەیت
خۆر بەئاسمانەوە نییە؟!
هەر وشەیەك...
لەلیَوەکانم هەلّوەریَن،
وریَنەیەو کەم و زۆر
مانایان نییە؟
پەیامی...
لیَوم ماچیَکەو..
دەمەویَت لەناو گولّدانی
لیَوەکانتا هەلّیان بگری
گەر...
ماچەکانی من نەبیَ،
رەنگە لەنیوە شەویَکدا
بیَ دەنگ بمری.

# دڵی ماچ

ئەو رۆژانەی...
دەرۆن و تیا ماچت ناکەم،
هەتا لێدانی دڵیشم وا هەستەکەم
ناتەواوە
دەڵێی...
کۆتایی دونیایە..،
رۆژ ئاوا دێتە رۆژ هەڵات،
رۆژ هەڵاتیش بۆ رۆژ ئاوا
خۆزگەم...
بەلێوەکانی خۆت،
کلیلی ئیلهامی منیان
لەماچێکەوە پێچاوە
ئەو رۆژەی...
لوتفی ماچێکت نەبێ گیانە،
شك نابەم تەنیا وشەیەك
بیکەم بەلەتێ هۆنراوە.





# مەرگی ماچ

کوژرانی ماچ و گەڵای هەڵوەیو
هەر دوو لەکۆستی لێومان دەکەوێ
من و خاك دەبین بەماتەم گێڕو
ئەستێرەش دێتە پرسەمان شەوێ
لێویشمان وەکو گەڵای پایزان
هەڵوەری و بارەش لەناکاو بردی
نەمزانی یاسای سروشت ئاوایە
وەمزانی خەزان تاوان بوو کردی
ئێستاش بەلێوی خەزانا گەڵای
ماچ و حەسرەتمان تەرمەکەی دیارە
دەڵێی مەسیحە بەدەم خاچەوە
دەڵێی حەلاجە لەبەر سێدارە.

# پایتەختی ماچ

کەلێوی تۆ منداڵێکی گرینۆکن
لێوی منیش بێشکەیەکی بێ نازکەوتوو
وەرەو لەناو پەڕی نەرمی لێوەکا نما
سۆزی دڵم ڕاتدەژێنێ و خامۆش بنوو
کەلێوی تۆ ڕووبارێکی پڕشە پۆلن
لێوی منیش بەیارێکی وشك و تینوو
وەرەو بەناو تینوێتیما شۆڕبەرەوە
لەناو پایتەختی ئەوینما بێ دەنگ بنوو
کەلێوی تۆ دارستانی چڕو زەنگن
لێوی منیش کۆترێکی بارەش بردوو
بە پەنابەری وڵاتی ماچەکانت وەرم بگرە
هاکا بەدەم قامچی باوە گیانم دەرچوو
کەلێوی تۆ ڕووبارێکی تیژ تێ پەڕو
لێوی منیش وردە ماسی ڕێ ون کردوو
یان ئەوەتا لەشەپۆلێکی تورەدا بمخنکێنە
یان بم دەرە دەم ماچێکی ئارام گرتوو.





# ئاونگی ماچ

بەهەورێکا هەموو ئەشقم
ناردووە تا بۆت بباری
یاخود ببێتە ئاونگی
سەر لێوی گوڵە هەناری
بۆم نوسیوە بەڵکو ماچی
لێوەکانی غەریبیت کات
ئەگەر زریان و توشی بوو
لەمن نایات درۆ دەکات
تۆش بەهەورێکی کۆچەرا
وەڵامێکی من بەرەوە
گەر وەڵامیشت پێ نیە
ماچەکانی زووم بەرەوە.

# گەردەلولی ماچ

بەماچی ئەو دوولێوانە
شەراب کوا مەستی تێدایە؟
وەرە ماچت بکەم تاکو
دوو لێوم هەستیان تێدایە
لەمەی لێوت شەرابی ماچ
بنۆشم تامن وشیارم
نەبا هەڵکات گەردەلولی
خەیاڵی شێتی ئاغ یارم
کەتۆ ئەو لێوە ئاڵآنەت
بکەن مەستی منی مەستیار
دەی ناگرم رێگەی خەرابات
فریشتەی جوان شۆخی عەیار
شیعرێکی نوێ کەماچی تۆ
هەوێنی وشەو دێڕی بێ
خەم بەلای دڵماندا نایات
دەبێ مەیخانە گۆڕی بێ.





# دەریای ماچ

کەمن بەماچی تۆ بژیم ئیتر
بێ لوتفی مەکە لەڕاستم چی تر
کەماچت دەکەم دەڵێی دەریایەك
ئاو دەرژێتە سەر دۆزەخێ ئاگر
لێوەکانی من داخن وەك پشکۆ
دەڵێی چلورەی ئاڵن لێوی تۆ
ئەو رۆژەی نەکەم ماچی لێوانت
لەناو دەرونم هەڵدەستێ بۆن سۆ
شەراب ناشکێنێ تینوێتی لێو بۆم
من فێری بادەی لێوەکانی تۆم
ئێستا مودمینی ماچی لێوت بووم
با بەرەو دەرگای مەیخانە نەڕۆم.

# تەزوی ماچ

سەرکردەکان
ڕۆژی چەندین کۆبونەوەی گەورە
دەکەن
بەخەندەیەکی ژەهراوی....
هەڵدەستنە پێ و تەوقەیەکی بێتام
دەکەن
هەزارەمین...
کۆبونەوە تێدە پەڕێ و..
دیسان هەر هیچ بەهیچ
ناکەن
بەڵام کاتێ...
لێوەکانی من و مەعشوقەکەی دڵم
بەیەك دەگەن
لەماچێکدا...
چارەسەری کێشەی گەورەو بچوکی
جیهانیش دەکەن.





# دەرگای ماچ

ئەم شەو....
هێند تـامەزرۆی ماچم،
وەکو بەرد لێوم دەکرۆژم
دەرگای...
ڕووناکی ماچێکت ناکەیتەوە،
بەناچاری شەڕ بەئەستێرە دەفرۆشم
کەحەزی من...
ئەوەیە لەدەمی خەودا..
ماچەکانت بڕژێنە سەر لێوەکانم
خۆ دەزانم تەنیا خەوە...
بەڵام چیبکەم ؟ خەون و خەیاڵ،
کەبەشێکن لەژیانم..،
هەوێنن بۆ شیعرەکانم.

# مێژووی ماچ

جەلادەکان...

چی دەزانن؟ لەوە زیاتر،

کەئازاری مرۆڤ بدەن؟

پیاو کوژەکان...

مانگو خۆریش بەر

دەسرێژی تفەنگ دەدەن

بەلام کاتێ...

لێوەکانی پەروانەو شەم،

بۆ ڕاموسان بەیەك دەگەن

هەر بەماچێك...

جوانترین سووتانی پیرۆز

لەمێژوودا تۆماردەکەن.





# خەونی ماچ

دەزانم...

تۆش لەمن زیاتر،

تینوی ماچی ئەم دوو لێوە

نەرمانەمی

چاوەڕوانی...

پە نجەم زوڵت بۆ شانەکاو

شەیدای بۆنی ئەم هەناسە

گەرمانەمی

ئەو شەوانەی...

خەو بەماچی لێوەکا نمەوە دەبینی

کەبەیانی بەیەك دەگەین لەخۆمەوە

هەست پێدەکەم

لێوەکانم...

هەر ئەو لێوانەن کەشەوێ،

لەئامێزی لێوتدا بوون ئیتربۆچی

ماچت نەکەم؟

# گوڵاوی ماچ

**ئەگەربێت و...**
**بەخت یاربێ و ماچێکت**
**کەم**
**ئیرەیی...**
**بەبای شەماڵ و بارەش**
**دەبەم**
**چونکە گوڵی لێوەکانت..**
**لەسەر لێوم دەپووشکێت و**
**بەیەك دوو ماچ..**
**گوڵاو ڕێژی دونیا دەکەم.**





# ماچی تەڕ

**کەداوای...**
**ماچم لێکردی، حەزتدەکرد،**
**بەلاّم شەرت پێ دەفرۆشتم.**
**ئەوە نەبوو...**
**دوای خولەکێ لێوت هێناو،**
**منیش وەك نەقوڵ کرۆشتم؟**

# ماچێك

ئەو...
پێکی شەرابی قەیرەبوو،
ئێواران لەکونجی مەیخانەی پیریدا
دەم نۆشی
هەناسەم...
یەك پارچە گوڵاو بوو،
کەسەرم بەمەستی دەنایە
ناو کۆشی
ساوابووم...
وەك منالْ ئەفسانەی نیگایەك،
بۆ کەنار رووباری ئەوینیْ
بردمی
ڕاوچی یەك...
بەتۆڕی دۆزەخی شەوانە،
لەتۆڵەی ماچێکی غەمگیندا
گرتمی.





# خوێن

لەنگی خوێنەوە...
عاشقی ماچێکی لێوت بووم،
کەڕەنگی لەڕەنگی ئەو دەچوو
لەڕەنگی لێوتەوە...
بەڕەنگی سووری خوێن ئاشق بووم،
کەڕەنگی لە ڕەنگی دوو لێوی تۆ دەچوو
بەخوێنت ئاشق بووم...
وەلێ من نە پیاوی جەلادو..،
نەسوپای شەڕکەری دووژمنم
گەر...
شەوێك لەخەودا بێداربویت
لێوێکت نەمابوو..،
بێگومان دزینی ئەو لێوەش هەرمنم.

# نزا

لەوەتای...
بەماچی دوو لێوت ئاشنا بووم،
شەوو ڕۆژ هەر بیری تۆ دەکەم
ئەترسم...
تەمەنم وەك پایز هەڵوەریٚ و..
ڕانەگەم دووبارە ماچێکی تۆ بکەم
نازانم...
ماچی تۆ مردنە یان ژیان؟
نازانم...
ماچی تۆ خنکانە یان سووتان؟
ئەوەندە دەزانم...
ماچێکت مردن و ژیانیش دەهێنیٚ
ئەو خوایە...
ماچی تۆ لەلێوی خەمبارم نەستێنیٚ.





# تانە

ئاخ لەسەرگەرمی مەستی دوای ماچیٚ
نازانم بۆچی گیانم دەرناچیٚ؟
نازانم بۆچی لێوت وەك نەشتەر
بە پەڕەی نەرمی دڵما ڕۆناچیٚ؟
کەماچت دەکەم وەك بروسکەی ژان
وەك پەڕەسێلکەی بەر شەستەی باران
لێوم دەلەرزیٚ و لێدانی دڵ چون
لەگیانەڵادا ستە دڵ لێدان
ئاخر گوڵەکەم ئەم ماچانەی تۆ
شەختەی سەهۆڵن یان ژیلەی پشکۆ؟
هەر واکە لێوم گەشتە سەرلێوت
هەر ڕۆح دەمێنیٚ بڵێم ها بیخۆ
خۆزگە دەمزانی سیحری ماچ و لێو
ئەفسانەی مێژوون یان ڕۆحی بزێو؟
ئەوسا بۆ ماچیٚ گیانم دەبەخشی و
گوێم نەدەدایە تانەی پڕجنێو.

# شەرم و ماچ

هەر تەنیا...
شەرمی تۆم پێ جوانە،
کەچاوت دەنێیتە سەر یەك و
لێویشت دەنێیتە سەر لێوم
هەر وەکو...
ماچ باڵم پێ بگرێت،
ئاسمانی ئەو دەم و لێوانەت
لەمەودای ماچێکدا دەپێوم
دەمزانی...
دڵی تۆش ئاشقەو
لێویشت تامەزرۆی
ماچ کردن
نەمزانی...
بەو ماچە تۆش وەك من،
سەد خۆزگە دەخوازی بەمردن.





# ماچ و گومان

بەلێوت...
پە یمانەی ماچێکم بۆ دێنی،
بەچاوت گومانی تاوانم
لێدەکەی
کەچی شەو...
دەچیتە بەر دەمی ئاوێنەو
سەد ماچی جێ لێوی
من دەکەیت
دەمزانی...
وەکو من خەو نایا بەچاوتاو
ئەم شەوت بەساڵێك
لێدەڕوا
نەبادا...
لەخەودا بێ ئاگا..،
شەوە بێ، هەنگوینی ماچەکەی
من بخوا.

# تۆڵە

من هاتم...
پێت بڵێم.. بمبوورە،
کەدوێنێ نەمتوانی
بۆت بێمە جێژوان و
ماچت کەم
تۆ خێرا...
دوو پەنجەی ناسکت
دەنێیتە سەر لێوم،
لەتۆڵەی ماچێکدا دەتەوێ
ماچت کەم





# نێوان

لەنێوانی...
لێوەکانی من و تۆدا..
هەناسە هەیەو نیگایەك،
لەبار دڵم هێشتا دووری
چاوەکانمان...
لەسەر یەك نێین..
هەناسەمان تێکەڵاوکەین،
ماچێ بکەین بۆ سەبوری.

# پشکۆی ماچ

گەر وەکو پشکۆ گڕت بەر دایە
خەرمانی وشکی ئەم دوو لێوانەم
نزای باران و دەستی سۆز ناکەم
نەبا دامرکێ ئەم کڵپەی ژانەم
پرچییشت وەکو پرچی شۆڕەبی
جار جارێ بە دەم بای شەماڵەوە
باوەشێنی کات پشکۆی سووری لێو
بۆ بمرم بە دەم پێکی تاڵەوە..؟
بەڵکو خامۆش بێ کڵپەی دەرون و
ڕۆچێ شە پۆلی هەڵچوی شێتی لێو
بەڵکو لێوم بێ بەکەشتی نووح و
لەنگەرێ بگرێ لەکێوی سەر لێو
ئەوسا لەترسی خنکان یان مردن
لێوی ماچ دەگرێ بۆ پەنا بردن
با لافاو بەناو خاکدا ڕۆنەچێ
ماچێکیش دەکەین بەدەریای بێبن.





# لێو

تۆ لێوت هێناو...
منیش وەك منداڵ،
شەرمم لەدارو بەردی
دنیا کرد
نەمزانی تۆ چۆن...
ئەو گوڕو تینەت
لەگیانی ترس و شەرما
پەیدا کرد؟
گەرچی نەگەشتین...
تێر بەکامی دڵ..،
ماچێ بکەین و تاسە
بشکێنین
هەر ئەبێ...
ڕۆژێ، ئەم قەلای ترسە
بەشۆڕشی ماچ هەرەس
پێ بێنین.

## وەرزی ماچ

**نێوانی...**
**من و تۆش، وەکو ساڵ،**
**سروشتی چوار وەرزی تێدایە**
**دەمێکی...**
**بەهارە و، دەمێکی پایزە..،**
**دەمێکی بەگەرمی و دەمێکی سەرمایە**
**ناتوانین...**
**تەمە نمان لەوەرزی بەهاردا**
**ڕابگرین بۆ ژیان. .،**
**هەر...**
**وەرزیٚ جوانێتی و..**
**پێناسەی ڕەنگێکی تێدایە.**





## یادەکانی ماچ

**تەمەن دەڕواو ...**
**ئەو ڕۆژانەی ماچت ناکەم،**
**لەگەڵ مردندا یەکسانن**
**سبەی دمرین...**
**ئەوەی کەدەمێنێتەوە بۆ یادگاری**
**ئەم شیعرانەو ماچەکانن**
**کەژیانیش...**
**تەنیا جارێك بێت و ئیدی**
**چارەنوسمان فەنا بوونە**
**بۆچی...**
**بەربانگی ماچەکان نەکەینەوە**
**لەو کانیاوی لێوە ڕونە؟**

# فریشتەی ماچ

کەسەیری...
ئاوێنە دەکەم، ماچەکانت
وەك فریشتە لەسەر لێوم
پێدەکەنن
کەرویان...
لێوەردەگێڕم، خەمەکانم
ئەوەندەی ( نوح )
بەتەمەنن
نازانم...
جارێکی تر بەختی..
ماچەکانی تۆم پێدەبڕێ ؟
یاخود...
بەسوێی ماچێکەوە..
مەرگ دێت و یەخەم دەگرێ .





# مانای ماچ

ڕۆژێك دادێ...
باڵندەکان بەشیعری ماچم
باڵ دەگرن
ئەو...
ڕۆژەشم لەبەر چاوە،
لەسەرماچێ لێوم دەبڕن
چەندە گێلن...
کەنازانن گیانی ماچ
لەناو دڵدایە
کەرەنگی ماچ...
خوێنی دڵ بێ.. چی
جوانترە لەو مانایە؟

# نەباتی ماچ

هاتم وەك فەرهاد...
بێستونی سەختی نەباتی لێوت
بەماچ هەڵكۆڵم
هەر...
قوڵینگێکم دەوەشاند زیاتر،
دڵنیا دەبووم من چەند كلۆڵم
دەمەوێ...
لوتكەی لێوێ بنكوڵ كەم،
هاكا بەسەرما هەرەسی هێنا
ئەوسا...
نەك لێوم سەرا پا گیانم،
قوربانی ماچە و سوورە لەخوێنا.





# دۆزەخی ماچ

لەوەتای تۆ...
تەزوی گەرمی ماچەكانت
لێ بڕیوم
گوڵی سووری...
شیعر ناگرن، لێوی بەبێ
ماچ تەزیوم
ئاخر گوڵم...
كەئیلهامی هەر شیعرێكم
لەماچێكی لێوتدا بێ
بە پشكۆیەك...
لێوم داخكە، ئەگەر دۆزەخ
لەنێوان لێویشتدا بێ.

# خەونە ماچ

**کە شاعیرێك...**
**لێوەکانی کانیلەی**
**ماچی پاراو بن،**
**خەو بینینی چاوەکانی**
**لەڕاست دەچێ**
**خۆ تفەنگ...**
**نانێم بەدڵی ئاشقەوە،**
**بۆچی دڕك لە لێوەکانم**
**هەڵبچێ ؟**
**من...**
**بە ئەوەش دڵم شادە..**
**هات لەخەوما ماچێکی**
**لەجیاتی دامێ**
**کە شێتانە...**
**لێی دەڕوانم زویر نابێ،**
**چونکە بۆ خۆشی دەزانێ**
**شێوەیەکی لەئەو دەچێ.**





# ماچ و خۆر

**کەبەیانیان...**
**تیشکی خۆریش لەنێوان**
**لێوی چیاوە دێتە دەرێ**
**ئەوەش...**
**ماچە...ئەگەر سروشت**
**وەکو من پەی بەماچ بەرێ**
**ئێوارانیش...**
**لەدەمی خۆر ئاوابووندا چیا دەڵێ،**
**- لەهاتنەوەت بەگومانم ماچم بەرێ.**

# ئاوێنە

ئاوێنەکەت...

بۆی باس کردم..،

دوێنێ شەو زۆر بۆم گریاوی

گوایە...

هەتا شەو درەنگان..،

گریان یەخەی بەر نەداوی

بەر لەخەوتن...

بەئاوێنەکەت وتووە..،

بێنە با تێر ماچت بکەم

نەبا سبەی...

من بمرمو پێ ڕانەگەم،

دوا ماڵ ئاوایت لێبکەم

بۆ گیانەکەم...

لەبەر ئاوێنەی چاومدا

پێ لەڕاستی ئەشق نانێی؟

بۆچی نایەی...

ئاوێنەی چاوەکانی من،

لەبەرانبەر خۆتا دانێی؟





# تاسەی ماچ

کە...

یەکەم جار ماچت کردم

دەنگێکی گەورەی دڵم هات،

وامزانی سنگمە کون بوو

لەنێوان...

دەم و لێوماندا..

پەشمەکی ڕۆح توایەوەو

خەمەکانیشمان لێ ون بوو

بۆیە...

ئێستاهەموو جارێ،

کەشیعری ماچ دەخونمەوە

وا هەست دەکەم...

ڕەنگی سووری لێوەکانتە

ڕژاوەتە ناو خوێنمەوە.

# نهێنی ماچ

گەر...
لێوەکانی تۆ نەبێ،
بەرگەی تاڵی و خەمی
ئەم رۆژگارە ناگرم
گەر...
ماچەکانی تۆ نەبێ،
شەڕی ئاسمانەکان ناکەم
ئەستێرەی شیعر داناگرم
بۆیە ئێستا...
بەدوای رووناکی لێوتدا
وەك تاریکی شەو دەگەڕێم
دەمەوێت...
بتدۆزمەوە، لەماچێکدا
نهێنی ماچت پێ بڵێم.





# هەتوان

نەخۆشم گیانە...
کوا قەڵەم لێوێ
دواین هەناسەم بۆ تۆمار
بکات؟
باڕەشی...
مەرگم هەڵیکردووە،
نازانم ماچێ هەتوانم دەکات؟
خەزان...
نیشتوە لەو دوو لێوانەی،
تاسەو حەزی تۆ سوور کردنی
بوو
هاکا...
پایزیش گەڵای لێوی من،
نێچیری لێوی ماچ کردنی
بوو.

# چاپکراوەکانی شاعیر

- جەستەی شارێکی مۆمیاکراو
- درۆکانی دەم رەشەبا
- خەمی کۆچە ناوەختەکان
- کاتژمێر سفر
- رووداوو کارەسات
- گومان
- هەناسە تەزیوەکانی با
- فریشتە
- لەتێ دڵ
- شەوێك لەبەر باران
- ماچ لەدەمی کەنارییەکاندا